# ئەو پیاوەی وا نەوسی خۆی کوشت

ن: سادیق هیدایەت

و: تاهیر حامیدی

"نەوس هەژدیهایە کوا ئەو مردووە

داخی بێ ئامرازی ماتی کردووە"   مەولەوی بەلخی

هەموو رۆژێک میرزا حسەینعەلی لە سەر کاتی خۆیدا، بە باڵتەی رەشەوە، دوگمەی داخراو، دوولنگەی دەقدراو و پێڵاوی رەشی بریقەدارەوە، بە رێک و پێکی هەنگاوی هەڵدێنا؛ لە یەکێک لە کۆڵانەکانی "سەرچاوە"وە دەهاتە دەرێ، لە بەر مزگەوتی "سپەهسالار"ەوە رادەبوورد، لە کۆڵانی "سەفی عەلیشا"وە بای دەداوە و دەرۆیشت بۆ قوتابخانە.

لە نێوان رێگادا تمیشای دەور و پشتی خۆی نەدەکرد. وا دیار بوو بیری ئەو لە لای شتێکی تایبەت بوو. قەڵافەتێکی مەند و نەجیب، چاوانێکی پچووک، لێوگەلێکی قوت و سمێڵێکی رەنگ خورمایی هەبوو. دایمە ریشی خۆی ماکینە دەکرد، زۆر حەیا بەخۆ و کەم قسە بوو.

بەڵام گاجار کاتی خۆراوا دەکرا قەڵافەتی لەڕی میرزا حسەینعەلی لە دەرەوەی دەروازە بناسیەوە وا دەستەکانی لە دواوە لەیەک هەڵپێکابوو، زۆر بە هێوری پیاسەی دەکرد، سەری داخستبوو، پشتی کۆم، وەک ئەوەی بۆ شتێک بگەڕێ، گاجار رادەوەستاو و زۆرجار لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد.

مودیر و باقی مامۆستایانی قوتابخانە نە خۆشیان دەویست و نە رقیشیان لێی بوو، بەڵکوو کاریگەرییەکی سیرڕاوی و سەیری لەواندا هەبوو. بە پێچەوانە، قوتابییەکان لێی رەزا بوون، چونکا قەت نەبیندرابوو تووڕە بێ و نەئەوەی بدا لە کەس. زۆر بە هێوری و نەرمەبڕییانە لەگەڵ قوتابییەکاندا هەڵسوکەوتی دەکرد. هەر لەبەر ئەمە بە پیاوێکی بێدڕک ناوی دەرکردبوو، بەڵام بەسەر ئەمەشدا قوتابییەکان لە نێو پۆلی ئەودا بەئەدەب و گوێڕایەڵی بوون.

تاقە کەسێک وا نێوانی لەگەڵ میرزا حسەینعەلیدا خۆش بوو و برێک جار قسە لە نێوانیاندا دەگۆڕدرایەوە، شێخ ئەبولفەزل مامۆستای عەرەبی و زۆریش خۆهەڵکێش بوو، لەپەستا باسی ریازەت و کەرامەتی خۆی دەکرد وا چەند ساڵ لە دونیای جەزمەدا بوە، چەند ساڵ قسەی نەکردوە و خۆی بە فەیلەسووفی رۆژگار، جێگری بووعەلی سینا و مەولەوی و جالینووس دەزانی. بەڵام لەو مەلا خۆخوازە رواڵەتپارێزانە بوو وا زانیارییەکانی

خۆی بە چاوی خەڵکدا دەکوتاوە. هەر قسەیەک دەهـاتە گـۆڕێ خێـرا مەتەڵـۆکێکی عەرەبـی نەشـۆردراوە، یـان شێعرێک لە شێعری شاعیرانی بە بەڵگەی ئەو دێنایەوە و بە بزەیێکی سەرکەوتوانەوە لە کـاریگەری قسـەکەی لە روخساری ئامادەبواندا دەگەڕا. ئەمەش لە نائاسایی دەچوو کە میرزا حسەینعەلی مامۆستای فارسـی و مێـژووی بەرواڵەت نوێخـواز و بـێ ئیـددیعا لەم دونیـایەدا شـێخ ئەبـوولفەزل بە هەواڵـی هەڵبژێـرێ، تەنـانەت جاروبـار شێخیشی دەبردەوە بۆ ماڵێ و گاجاریش دەچوو بۆ ماڵیان. میرزا حسەینعەلی لە بنەماڵەیێکی ناسراو، مرۆیەکی زانا و لە هەر بوارێکەوە رێک و پێک بوو و بە واتەی خەڵـک لە دارولفونـوونەوە دەرچووبـوو. دووسـێ سـاڵ لەگەڵ باوکی لە راسپاردەییدا کاری کردبوو، بەڵام لەو سەفەرە دوایینە وا گەڕایەوە، لە تاراندا نیشـتەجێ بـوو و کەسپی مامۆستایی قۆتابخانەی هەڵبژارد هەتا کات مۆڵەتی بدات و خەریکـی کـارە تاکەکەسـییەکانی خـۆی بـێ، چونکا ئەو کارێکی سەیر و تاقیکارییەکی پڕئاستەنگی وەئەستۆ گرتبوو.

لە منداڵییەوە، کاتێک مەلای تایبەتی بۆ وانە کوتن بەوو براکەی دەهاتە مـاڵێ؛ میـرزا حسـەینعەلی لێهـاتوویی و شیاوییەکی تایبەتی لە فێربوونی وێژە و شـێعری سـۆفییەکان و فەلسـەفەی ئەوان لە خـۆ دەنوانـد، تەنـانەت بە شێوازی سۆفییەکان شێعریشی دادەنا. مامۆستاکەیان شـێخ عەبـدوڵڵا وا خـۆی لە ئەهڵـقەی سـۆفیەکاندا دەزانـی ئاگادارییەکی تایبەتی سەبارەت بە قوتابییەکەی لەخۆ دەنواند، بیروڕای سـۆفییەکانی لە دڵـی دەخسـت و باسـی کەش و هەوای عـارف و سـۆفیەکانی بـۆ دەگێـڕایەوە. بە تـایبەت بەرزی پلەوپـایەی مەنسـووری حەللاجـی بـۆ گێڕابۆوە کە مەنسوور بە پێگەی ریازەتی نەوس گەیشتبووە پلەیەک لە سەر سێدارەدا "انا الحق"ی دەکـوت. ئەم چیرۆکە لە بیری لاوی میرزا حسەینعەلیدا زۆر شاعیرانە بوو. ئاخری رۆژێک شـێخ عەبـدوڵڵا پێـی کـوت: "بەو هەوێنەی لە تۆدا دەیبینم هەرگا شوێن کەوتووی لایەنگرانی تەریقەت بی بە پلەوپایەی چـاک دەگەی." ئەم هـزرە دایمە لە بیری میرزا حسەینعەلیدا بوو، لە مێشکیدا گەشەونەشەی کرد و بنجی داکوتا و دایمە ئـاواتی ئەمە بـوو کە کاتێکی تایبەت بدۆزێتەوە و خەریکی کار و ریازەت بـێ. دواتـریش خـۆی و بـراکەی چـوونە قوتابخـانەی دارولفونوونەوە و لەوێشدا میـرزا حسـەینعەلی لە عەرەبـی و وێـژەدا زۆر لێهـاتوو بـوو. بـرا چکـۆلەکەی لەگەڵ بیروڕای ئەودا تەبا نەبوو، گاڵتەی پێدەکرد و دەیکوت، ئەم خەیـاڵانە بـێجگە لەوەی مـرۆ لە ژیـان دوا بـخەن و بێهۆ لاویت بفەوتێنێ ئاکامێکی دیکەی نیە. بەڵام میرزا حسەینعەلی لە دڵی خۆیـدا بە قسـەکانی ئەو پێـدەکەنی، بیری ئەوی بە هزرێکی ماکی و پچووک دەزانی و لەسەر بڕوای خۆی زیاتر لاسار دەبـوو و هەر بە بـۆنەی ئەم دژایەتی بیروبۆچوونە، دوای مردنی باوکیان لێک جودا بوونەوە. ئەو شتەی هەمدیسان ورەی بە بیری بەخشی، ئەوە بوو کە لە سەفەری ئەم دواییانەدا بۆ کرمان رووبەڕووی دەروێشێک بۆوە و دوای لێدوانێکی زۆر ئەویـش قسەکانی میرزا عەبدوڵڵای مامۆستایانی پەسند کرد و بەڵێنی دایێ هەرگـا لە سـۆفیگەریدا تێکۆشـێ و ریـازەت بکێشێ بە پلەوپایەی بەرز دەگات. ئاوەها بوو میـرزا حسـەینعەلی پێـنج سـاڵ خـزایە نێـو سووچنشـینییەوە و درگای لە خزم و ناسیاو داخست و دوای بەتاڵ بوون لە کاری مامۆستایی زیاتری کـار و ریـازەتی ئەو لە مـاڵێ دەستی پێدەکرد.

ماڵەکەی وەک هێلکە پاک و پچووک بوو. نەنێ ئاشپەز و شاگردێکی لە ماڵەوە هەبـوو. هەر وەژوور دەکەوت بە پارێزەوە لیباسەکانی دادەکەنـد، بە لیباسـگیرەوە هەڵیدەواسـی، ئاودامـانێکی خـۆڵەمیش رەنگـی دەکـردە بەر و دەچوە کتێبخانەکەی. گەورەترین وەتاغی ماڵی بۆ کتێبخانەکەی تەرخان کردبـوو. لە سـووچی ئەوێـدا لە پەنـای پەنجەرەکە دۆشەگێکی سپی دانرابوو، دوو پێخەف بەسەریەوە، لە بەردەمیدا مێزێکی کورت، چەنـد بەرگ کتێـب بەسەریەوە و بەستەیەک کاغەز و قەڵەم و جەوهەر لە سـەریدا دانرابـوو. کتێبەکـانی سـەر مێـزەکە بەرگەکانیـان نیمداشت ببوو و باقی کتێبەکان بە بێ قەفەزبەندی لە سەر تاقەکانی وەتاغەکەدا هەڵچندرابوون.

بابەتی کتێبەکان عیرفان و فەلسەفەی قەدیم و سۆفیگەری بـوو، تەنیـا سـەرقاڵیی ئەو، خوێنـدنەوەی ئەم کتێبـانە بوو، کە هەتا نیوەشەو لەبەر چرانەوتیدا لە پشت مێزەکەدا ژێروبانیـانی دەکـرد و دەیانیخوێنـدەوە. لای خـۆی لێکیانی دەداوە و لە هەرکامیان دوودڵ و لای ئەو چەوت بوایە هەڵیدەگواست هەتا دواتر لەگەڵ شێخ ئەبـولفەزل بیداتە بەر قسەوباس. میرزا حسەینعەلی لە زانینی مانای ئەواندا دانەمـابوو، بەڵکـوو ئەو زۆرێـک لە پانتاکـانی رۆحی و فەلسەفی تێپەڕاندبوو و زۆر چاکتر لە شـێخ ئەبـولفەزل رێـی دەبـردە بیـروڕای وردبینـانە و شـێعری سۆفیەکان، لە خۆیدا هەستی بەوان دەکرد و دونیایەکی لەوپەڕی دونیای ماکی لە بیری خۆی دا دروست کردبـوو و هەر ئەمەش ببوە هۆی خۆخوازی ئەو؛ چونکا ئەو خۆی لە خەڵکی دیکە بە زلتر دەزانـی و لەم سـەرتربوونەی خۆی بەتەواوی خاترجەم بوو.

میرزا حسەینعەلی دەیزانی کە سـیڕ و رازێـک لە دونیـادا هەیە و سـۆفیە گەورەکـان رێیـان تـێ بـردوە و ئەم بابەتەش لای ئەو ئاشکرا بوو کە بۆ دەستپێکردن، پێشەوایێکی پێویستە یان کەسێک هەتا ئەو رێنوێنی بکـات، هەر بەو جۆرەی شێخ عەبدوڵلا پێی کوتبـوو کە: "چونکـا بیـری رێـڕەو لە دەسـپێکدا لە پرشـوبڵاویدایە، دەبـێ روخسـاری پیـر بێنێـتە بەرچـاو هەتـا خـاترجەم بـێ." ئەمە بـوو بە هـۆی ئەوەی دوای گەڕانێکـی زۆر شـێخ ئەبولفەزلی دۆزییەوە، ئەگەرچی تەواو پەسندی ئەویش نەبوو و بـێجگە لە فرمـان دان چـی دیـکەی نەدەزانـی و رووبەڕووی هەر بابەتێکی گران دەبۆوە وەک ئەوەی لەگەڵ منداڵ بدوێ، دەیکـوت هێشـتا زوە و دواتـر باسـی لێدەکەین و ئاخری تەنیا شـتێک شـێخ ئەبـولفەزل پێـی رادەسـپارد کوشـتنی نەوس بـوو، ئەمەی بە دەسـپێکی هەموویان دەزانی. یانی بە ریازەت کێشان بە سەر نەوسی هاندەردا فایەق بێ و باسێکی وتارئاسای بەربـڵاوی پڕ لە حەدیس و شێعری لە بواری کوشتنی نەوس بۆ ساز کردبوو و بۆی دەخوێنـدەوە. وەک یەکـێ لەوانە ئەم حەدیسەی وا: " اعدى عدوك نفسك التى بين جنبيك" واتە " نەیارترین نەیاری تۆ خۆتی کە لە دەروونتدایە" و ئەم حەدیسەی دیکە:"جهادك فى هواك" هەر وەک ئەوحەدی دەڵێ: " هەرکەسێ نەوسی کوشت، خەباتکارە."

هەمدیسان لەم شێعرەدا:

" نەوس ئەگەر شۆخ و چەلەنگە تۆ لە زیندانی بکە

خەنجەری زۆرداریيە رایبگرە کێلانی بکە"

هەروا ئەم شێعرەی دیکە:

"نەوسی خۆت ڕاگرە خەبات ئەمەیە

ئەوپەڕی پیاوەتی و کەماڵ ئەمەیە"

لەو شتانەی وا شێخ ئەبولفەزل بەدەم مۆعیزەکەی خۆیەوە کوتبووی ئەمە بوو. " کە ڕێڕەوی ڕێگای عیرفان دەبێ ماڵ و مناڵ و شان و شکۆ و مەزنایی بە هێند نەگرێ، کە بەرزترین دەوڵەت و چێژ، گوێڕایەڵ کردنی نەوسە.

هەر بەو جۆرەی مەکتەبی دەڵێ:

"کۆشکی نەوست ئەگەر بڕووخێنی

دەوڵەتی تاهەتا دەسازێنی"

" تۆ بزانە هەی هەڤاڵی ڕێگا ئەگەر تاقە جارێک ئەلهای نەوس لە خشتەت ببات هەنگاوت لە سارای قەلاچۆ نــاوە هەروەک سەنایی دەفەرمێت:

" تاکوو نەوست ڕەنجەڕۆ کەی ئەو گزیری تۆ دەبێ

هەر کە میری پێ بدەی رووی سەد وەکوو تۆ کەم دەکا"

هەروەتر شێخی سەعدی دەڵێ:

"کێ حەزی بۆ جێبەجێ کەی گوێ لەمستی تۆ دەبێ

پێچەوانە نەوسی تۆ، کامی دەیەی فرمان دەدات"

" هەروەها شێخان نەوسیان بە سەگێک زانیوە یانیگر و دەبێ بە زنجیری ریازەت بیبەسیتەوە و دایمە ئاگاداری دەرباز بوونی ببیــت. بەڵام ڕێــڕەو نــابێ لە خــۆ دەرچــێ و رازی نهێنــی لای خەڵکــی نەزان بــدرکێنێ، بەڵکــوو پێویستە لە هەر کۆسپێکدا پرس وڕا لەگەڵ پێشەواکەی خــۆی بکــات. هەروەک خــواجە حــافز بە رەحــمەت بــێ دەفەرمێت:

"کوتی ئەو یارە کەوا داروپەتی بۆ هەڵخرا

ئاشکرا کردنی رازیان لە بۆ ئەو کرد بە سزا"

میرزا حسەینعەلی لە مێژ بوو ئۆگرییێکی تایبەتی بە فەلسەفەی هێندی و ریازەت هەبوو و ئاواتەخواز بــوو هەتــا بۆ تێر کردنی زانیارییەکانی خۆی بڕوا بــۆ هێندســتان و بگــاتە خزمەتــی جــووکی و مەهاتماکــان و رازەکــانی ئەوان فێر بێ. هەر لەبەر ئەمە بوو لەم پێشنیارە هــیچ دانەچڵەکــی، بەڵکــوو بە پــێچەوانە بە ئیمــانێکی تەواوەوە

بەرەوپیری چوو و هەر ئەو رۆژە وا گەڕایەوە بۆ ماڵێ لە مەسنەوییە دەسنووسەکەی [مەولەوی] فاڵێکی گرتەوە و بە هەڵکەوت ئەم شێعرانەی بۆ هات:

"نەوسی تۆ پەیمان شکێنە بۆیە بۆ کوشتن دەبی

پەستە رووگەی ئەو، ئەتۆش روو لەو بکەی هەروەک ئەوی

پڕبە پێستی نەوسەکانە ئاوەهایێ بەزم و کۆڕ

بۆ لەشی مردوو شیاوە جاو و کفن و تات و گۆڕ

نەوسی تۆ بیرتیژە بۆیە تۆی لەڕێ دەرکردوە

رووگەی ئەو دونیایە بێشک، تێبگە ئەو مردوە

ئاوی فرمانی حەقە وا گەیشتوە بەم مردوە

هەر لە خۆڵی مردوو ئەم گیانبەخشیەی ساز کردوە!"

ئەم فاڵ گرتنەوە بوو بە هـۆی ئەوەی میـرزا حسـەینعەلی بـێ سـێ ودوو بڕیـاری دا و هەوڵ و تەقـالای خـۆی خەساری سەرکەوتن بەسەر نەوسی دڕندەدا کرد و سەرقاڵی ریازەت بوو. غەوارەتر لە هەمـوو شـتێک ئەوەی کە هەرچی زیاتر دەچوە نێو کتێبی سوفییانەوە، زیـاتر لەسـەر ئەم خەبـاتە پێـداگری دەکـرد. لە ریسـالەی نـووری وەحدەتدا نووسیبووی:

" ئەی سەرۆک، چەنای چەند رۆژ ریازەتێک بە خۆدا بێنە و نەوسەکان دەبێ لەم بیرەدا دەکارکەی، هەتا خەیاڵی بێهۆ لە رێگە بەدەر بێ و بیری حەق جێگری ئەو."

لە کەنزەڕڕمووزی میرحسەینیدا خوێندیەوە:

"بیگرە و رێگای نەدەیتێ، دەمکوتی کە

ماری هاندەر بۆ گوناحە سەرکوتی کە"

لە کتێبی میرسادولعیبادادا نووسیبووی:

" تۆ بزانە رێڕەو هەرگا دەست بکا بە خەبات و ریـازەتی نەوس، رێگـای دەکـرێتەوە بـۆ ملـک و مەلەکـووت و لەهەر جێگە و پێگەیەکدا بە پێی مەقام، رووداوەکان ئاشکرا دەبن."

هەروەها لە شێعرەکانی ناسرخوسرەودا خوێندیەوە:

"هەژدیهات هەیە لەسەر خەزێنە

بیکوژە و خۆت لە خەم بڕەخسێنە

بەخێوی بکەی، تۆ ترسەنۆکی

لە داهاتی ژین بێبەروبۆکی"

هەمووی ئەم بەیتە ترسێنەرە پڕ لە ترساندن و هیواداریانەی وا بۆ کوشتنی نەوس نووسراوبوون، شکیان بۆ میرزا حسەینعەلی نەهێشتەوە کە هەوەڵ هەنگاو لە نێوان ڕێگەی سلووکدا کوشتنی نەوسی دڕندە و شەیتانییە وا لە گەیشتن بە چاکەدا بەرنگاری مرۆ دەبێتەوە. میرزا حسەینعەلی هاوکات دەیەویست هەم لە ڕێگای لایەنگرانی بیر و بەڵگەهێنانەوە و هەم لە ڕێگای لایەنگرانی ریازەت و خەباتی نەوس خۆی خاوێن کاتەوە. بەقەدەری حەوتوویەک لەم بوارەدا تێپەڕی، بەڵام ئەوەی دەبوە هەوێنی دڵساردی و بێ هیوایی ئەو، شک و دوودڵی بوو، بە تایبەت دوای وردبوونەوە لە بڕێک لە شێعرەکان وەک ئەم شێعرەی حافز:

" لە سیرڕی ڕۆژگار مەدوێ وو باسی چاوش و مەی کە

مەسیلەی وا بە زانایان، نە هەڵهاتوە و نە هەڵدێنرێ"

یان ئەمەی دیکە:

" دەرفەتێکی خۆش لەبۆت رەخسا، ئەتۆ بیقۆزەوە

کێیە ئاگای لێیە، ئاخۆ چۆن دەبێ ئاکامی کار!؟

ئەگەرچی میرزا حسەینعەلی دەیزانی، وشەی مەی، کەلاوا، پیری موغان و هتد لە تیز و تانە و دەستەواژەی عارفەکانن، بەڵام بەسەر ئەوەشدا لێکدانەوەی بڕێک لە چوارینەکانی خەییام بۆی زۆر ئەستەم بوو و بیری ئەوی دەشڵەژاند.

" لەم ڕێگە درێژەوە کە مەرگی ناوە

کێ هاتەوە باس و خەبەری هێناوە؟

وەستان لە دووڕێیانی نیازی پڕوپووچ

بێهوودەیە هەرچی چوو، نەهاتە دواوە"

یان ئەم چوارینەیە:

" تا باخی گوڵی بەخت و جوانیت لەبەرە

سەرخۆش بە، دڵت خۆش کە، چوەختی کەسەرە؟

ئەو ڕۆژی لەدەس دەچێ وەگیر نایەتەوە

چەپ گەردی زەمانە دوژمنی قەستەسەرە"

ئەم مامۆستایانە بانگەوازیان بۆ خۆشی دەکرد لە کاتێکدا ئەو هەر لە هەوەڵی لاوی خۆیەوە تەواوی خۆشییەکانی لە خۆی قەدەغە کردبوو و بیری ئەمانە داخێکی تاڵی لە ژیانی رابوردووی تێدا چێ کردبوو. ئەم ژیانەی وا ئەوەندە لەودا لەخۆبوردوویی کردبوو بە تاڵی رایبواردبوو و ئێستە ڕۆژگاری بە شێوازێکی ئێشاوی خەساری گەڕان بە شوێن بیرێکی گوماناوی دەبوو! دوازدە ساڵ بوو رەنج و کەسەری تووشی خۆی کردبوو، چێژی لە خۆشییەکانی لاوی نەبردبوو و ئێستاش دەسخاڵی مابۆوە. ئەم شک و دوودڵییە تەواوی ئەم بیرانەی لێ کردبووە تاپۆگەلێکی سامناکەوە وا دەکەوتنە شوێنی. بەتایبەت شەوانە لەو نوێنە ساردەیدا کە دایمە تاق و تەنیا تێیدا دەتلایەوە، هەرچێک دەیەویست بیری بەرەو دونیا ڕۆحانییەکان ببات هەر خەوی لێدەکەوت و بیری تاریک دەبوو سەدان جۆرە دێو دەکەوتنە کەوڵی. چەندە ڕێدەکەوت کە هاشەوار لە خەو رادەچەنی و ئاوی ساردی دەدا بە دەووچاویەوە، ڕۆژێک دوای ئەوە، خواردنی خۆیی کەمتر دەکردەوە و شەوانە لەسەر کا دەخەوت. چونکا شێخ ئەبولفەزل دایمە ئەم شێعرەی بۆ خوێندبۆوە:

"نەوس ئەگەر تێر بێ چەتوونی دەکات

سڵ و قوشقی دەبێت و جووتە دەخات"

میرزا حسەینعەلی دەیزانی هەرکات هەڵخلیسکێت رەنج بەخەسار دەبێت، هەر لێرەوە ریازەت و ئەشکەنجەی لەشی خۆی زیاد دەکرد. بەڵام هەرچی خۆی زیاتر دەخستە جەزرەبەوە، دێوی ئاڵۆش زیاتر ئەشکەنجەی دەکرد. هەتا ئەوەی بەڵێنی دا بڕوات بۆلای تاقە هەواڵ و پیر و پێشەوای خۆی ئاغەشێخ ئەبولفەزل و باسی بەسەرهاتەکانی بۆ بگێڕێتەوە و فرمانێکی گشتی لێ وەربگرێت.

ئەو ڕۆژەی ئەم خەیاڵەی بۆ ساز بوو دەمەو خۆراوا بوو، جلەکانی گۆڕی، دوگمەکانی باڵتاکەی بە ڕێکوپێکی داخست و بە ئەسپایی بەرەو ماڵی پێشەوا وەڕێ کەوت. کاتێک گەیشت، بینی پیاوێک بە تووڕەییەوە لە بەر درگایان وێسابوو، هاواری دەکرد و قژی خۆی دەڕنی و بەرز دەینەڕاند:

" بە ئاغەشێخ بڵێ، سبەینێ دەتبەمە دادگە لەوێ جوابم بدەیەوە، کچەکەمت بۆ خزمەتکاری بردوە و هەزار بەڵات بەسەریدا هێناوە، نەخۆشت خستوە، پووڵەکەشت خواردوە، یان دەبێ سیغەی کەی یان سکت هەڵدەدڕم، ئابڕووی چەنای چەند ساڵەم با بردی ..."

میرزا حسەینعەلی خۆی پێنەگیرا، ڕۆشتە پێشەوە و بە هێواشی کوتی:

" کاکە، تۆ بەهەڵەدا چووی. ئێرە ماڵی شێخ ئەبولفەزلە."

"ئەرێ هەر ئەو بێ دایک و بابەیە، هەر ئەو ئاشێخە خودا نەناسەیە. من دەزانم لە ماڵەوەیە، بەڵام خۆی شاردۆتەوە، پیاوە بێتە دەرێ ئاشێکی بۆ بنێمەوە کەس ئاشی وای بانەدابێت، ئاخری یەک دەبینینەوە!"

میرزا حسەینعەلی کە دیتی باسەکە جیددیە خۆی لادا و بە هێواشی دوور کەوتەوە، بەڵام هەر ئەم قسانە بەس بوو هەتا ئەو داچڵەکێنێ. تۆ بڵێی راست بووبێ؟! هەڵەی نەکردوە؟! ئەو شێخ ئەبولفەزلەی وا کوشتنی نەوسی پێش هەموو شتێک رادەسپارد، بڵێی خۆی نەیتوانیبێ لەم خەباتەدا سەرکەوێ؟ بڵێی خۆی پێی هەلخلیسکابێت یان ئەوی کردبێتە داردەستی خۆی و هەڵیفریواندبێت؟ زانینی ئەم بابەتە بۆی زۆر گرنگ بوو. ئەگەر راستە، بڵێی هەمووی سۆفییەکان ئاوەها بووبێتن و شتهاییکیان دەکوت وا خۆیان بێبڕوا بووبێتن پێیان و یان ئەم کارە تایبەتی پێشەواکەی ئەوە و لە نێو پێغەمبەرەکاندا ئەو جرجیسی دۆزیوەتەوە؟ ئایا دەتوانێ بڕوات و تەواوی ئەشکەنجە رۆحیەکان و تەواوی نامەتییەکانی خۆی بۆ شێخ ئەبولفەزل بگێڕێتەوە و ئەم مەلایە چەند رستە عەرەبی بڵێت، فرمانێکی دژوارتری پێبدات و لە دڵیەوە پێی پێبکەنێ؟ نا، هەر ئەمشەو دەبێت ئەم رازە ئاشکرا بکات. بەینێک لە شەقامە چۆڵەکاندا هەڵسووڕا. دوایی تێکەڵی جەماوەر بوو، بە بێ ئەوەی بیر لە شتێک بکاتەوە، لە نێوان ئەم جەماوەرەیدا وا بە پەست و ماکییانی دەزانی هێواش بە رێدا دەرۆیشت. هەستی بە ژیانی ماکی و سەرەکی ئەوان لە خۆیدا دەکرد و پێی خۆش بوو ماوەیەکی زۆر لە نێوانیاندا پیاسە بکات، بەڵام وەک شتێک بەڵێنی دەم و دەستیی دا و بەرەو ماڵی شێخ ئەبولفەزل گەڕایەوە. ئەمجار ئیدی کەس لەوێ نەبوو. دای لە درگا و خۆی بەو ژنە ناساند وا هاتە پشت دەرکە. ماوەیەکی خایاند هەتا دەرکەیان لە سەری کردەوە. کە چوە نێو ژوورەکەوە دیتی شێخ ئەبولفەزل بە چاوە خێل و سەرووچاوە ئاوڵاوییەکەیەوە و ریشە خەنەییەکانی وا لە مرەبای هەڵووچە دەچوو لە سەر بەڕە دانیشتوە، تەسبێح بادەدات و چەند بەرگ کتێب لە پەنایدا کرابوونەوە. هەر ئەوی دیت لاخێزێکی کرد و کوتی یا ئەڵڵا و گەرووی ساو کرد. لە بەردەمیدا دەسرەیەک داخرابوو، بڕێک نانەڕەقە و پیوازێکی تێدا بوو. رووی تێکرد و کوتی:

" فەرموو وەرە پێشەوە، شەوێکیش لەگەڵ فەقیرەکان شێوی بکە!"

" نا، زۆر سپاس ... ببوورن ئەگەر بوومە زەحمەت، لەمانەوە رادەبووردم هەر ویستم بێم ... "

" نەخێر ئەوانە چ باسە. ماڵی خۆتانە."

میرزا حسەینعەلی ویستی شتێک بڵێ، بەڵام هەر لەم کاتەدا قوولە و هەرا سازبوو و پشیلەیەک بازی دایە نێو وەتاغەوە و کەوێکی کوڵاوی بە دەمەوە گرتبوو و ژنێک بە شوێنیدا فسەفسەی لێدەکرد. میرزا حسەینعەلی چاوی بە شێخ ئەبولفەزل کەوت وا لەناکاو عابای حەوا دا، بە کراس و دەرپێوە دەستی برد تێڵاییکی لە سووچی وەتاغ هەڵگرت، وەکوو شێت کەوتە شوێن پشیلە. میرزا حسەینعەلی بە بینینی رووداوەکە قسەکەی خۆی لە بیر چۆوە

و له جێی خۆیدا وشک هەڵگەڕابوو. هەتا ئەوەی دوای چارەگە سەعاتێک شێخ، رەشهەڵگەڕاو هاسکەهاسک هاتە ژوورەوە و کوتی:

" دەزانی شەرع دەفەرمێ پشیلە زیاتر لە حەوسەد دینار زەرەر بگەیەنێت زیانی خورۆیە و کوشتنی واجبە."

میرزا حسەینعەلی ئیتر گومانی بۆ نەماوە کە ئەم پیاوە کەسێکی زۆر ئاساییە و ئەو شتانەی وا ئەو پیاوەی لەبەر دەرکی ماڵەکەیدا پێی دەکوت راست هەروایە. هەستا و کوتی:

" ببوورن، ئەگەر زەحمەتم دان ... لەسەر ئیزنتان. "

شێخ ئەبولفەزل هەتا بەر درگا رەوانەی کرد. هەر کە گەیشتە سەر کۆڵان، هەناسەی ئاسوودەیی هەڵکێشا. ئێستا ئیدی ئارخەیان بوو، حەریفی خۆی دەناسی و تێگەیشت کە تەواوی ئەم دامودەزگا و فرتوفێڵانەی شێخ، بۆ ئەو بوە، کەوی خواردوە، ئەوسا عومەرئاسا بەرانبەری خۆی لە کەوڵەکەدا نانەڕەقە و پەنیری کەرەکیفاوی و پیازە وشکی داناوە، هەتا خەڵک هەڵفریوێنێت. فرمان بەو دەدات هەتا رۆژی بادەمێک بخوات. خۆی خزمەتکاری ماڵ ئاوس دەکات و بە تامولامەوە ئەم شێعرەی عەتتاری بۆ دەخوێندەوە:

خۆت لە زۆر خواردن بپارێزە کوڕم

وەک درندە بەسیە خوێن ڕشتن کوڕم

نەوسی خۆت بگرە و بە رۆژوو بیکە دیل

بەستە پارووپەک، بەوەی نابی زەلیل

پیاوی پیاوانی بە رۆژوو، رەنجەڕۆ

بیکە بە سەرتۆپی عالەم نەوسی خۆ

نەک بە تەنیا خۆت لە خواردن دوور خەوە

ئەو لە هەرچی کار و بارە دوورکەوە

وڵات تاریک بوو. میرزا حسەینعەلی دیسانەوە تێکەڵی خەڵک بۆوە، وەک منداڵێک وا لە نێو جەماوەردا ون بێت، قەیرێک بە بێ ئیزنی خۆی لە کۆڵانە شلووق و تۆزاوییەکاندا گەڕا. لەبەر رۆشنایی چرادا تمیشای روخسارەکانی دەکرد، تەواوی ئەم روخسارانە مات و خەماوی بوو. سەری بەتاڵ و گرییەکی زلە لە دڵیدا بوو، ئەم خەڵکەی وا بە رای ئەو پەست، پێملی زگ و ئالۆشی خۆیان بوون و پارەیان دەچنییەوە، ئێستا ئەوانی لە خۆی بە عاقڵتر و گەورەتر دەزانی و ئاواتەخواز بوو لە جێی یەکێک لەوان بێت. بەڵام لەبەرخۆیەوە دیکوت: دەزانی؟ گاهەسە نامەتتر لەویش لە نێوانی ئەواندا ببێت. ئەو دەیتوانی لەسەر رواڵەت حوکمیان لەسەر بدات؟

سواڵکەری سەر شەقام بە قڕانێک لە دەوڵەمەندترینی خەڵک بەختەوەرتـر نەدەبـوو؟ بەجۆرێـک تەواوی پـارەی دونیا نەیدەتوانی لە ئازارە دەروونییەکانی میرزا حسەینعەلی بە موو کەم بکاتەوە.

ئەواوی ئەو تاپۆ خۆفناکانەی وا زۆرجار روویان تێدەکرد، ئەمجار خراپتر و توندتر هورووژمیان بـۆ هێنـابوو. وای تێدەگەیشت کە ژیانی ئەو بێهۆ بەسەر چوە، بیرەوەریە شڵەژاو و تێکەڵاوەکانی ماوەی سی ساڵی، لە پـێش چاوی رادەبورد، خۆی بە بێبەخت و بێقازانج تریـنـی جانەوەرەکـان دەزانـی. سـوورەکانی ژیـانی ئەو لە پشـت هەورگەلێکی رەش و تاریکەوە خۆیان دەردەخست،

برێـک لە لەتەکـانی ئەو لە ناکـاو دەدرەوشـایەوە، دوای ئەوە لە پشـت پەردەوە خـۆی دەشـاردەوە، هەموویـان یەکدەس و هیلاکی هێنەر و دڵتەزێن بوون. گاجار خۆشییەکی پووچەڵ و کورت وەکوو هەورەتریشـقەیەک وا لە سەر هەورە رەشەکانەوە رادەبوورێت، لە دڵی ئەودا هەموویان پەست و بێهۆ بوون. چ گێرەوکێشەیەکی پووچەڵ! چ هەڵات هەڵاتێکی فشە! پرسیاری لە خۆی دەکـرد و لێـوی خـۆی دەکرۆشـت. تـافی لاوی ئەو لە خەڵوەنشـینی و تاریکیدا رابوردبوو، بە بێ خۆشی، بە بێ شادی، بە بێ ئەوین، لە هەموو کەسێک و لە خۆشی بێـزار بـوو. تـۆ بڵێی چەندێک لە خەڵک گاجار خۆیان لە مەلێک وا لە تاریکایی شەودا دەناڵێنێ بە ونبووتر و ئاوارەتر دەزانن؟ ئەو ئیدی نەیدەتوانی بڕوا بە هیچ باوەڕێک بکـات. ئەم پێککەیشـتنەی ئەو لەگەڵ شـێخ ئەبـولفەزل خەرجێکـی زۆری بۆی هەڵگرت. چونکا تەواوی بیروڕای ئەوی ژێـرەوژوور کـرد. ئەو هـیلاک و تینـوو بـوو و دێـو یـان هەژدیهایەک لەودا زیندوو ببوەوە کە لەپەستا ئەوی زەخمار و دەرمانداو دەکرد. لەم کاتەدا ماشێنێک لە پەنـایەوە رابوورد و لە بەر چراکەیدا روخسارە تووڕە، لێوە لەرزۆک، چـاوە داپچـڕاو و نالەبارەکـانی ئەو بە شـێوازێکی خۆفناکەوە رووناک بۆوە. نیگای ئەو لە بۆشاییدا ون ببوو، دەمە نیوە داپچـڕاوەکەی لەوە دەچـوو بە شـتێک لە دوورەدەستدا پێدەکەنی و هەستی بە تەوژمێک لە قاری مێشـکی خۆیـدا دەکـرد وا لەوێـوە هەتـا ژێـر تەوێـڵ و لاجانگەکانی دەهات و گنجی خستبوە بەینی برۆکانی.

میرزا حسەینعەلی هەستی بە ئێشێکی سـەرتر لە بەشـەر کردبـوو. کاتەکـانی خۆشـی، سـەرگەردانی و کوڵـۆڵی دەناسی و ئەو ئێشە فەلسەفییانەشی دەزانی وا بۆ جەماوەری خەڵک هەر نەشـبوو. بەڵام ئێسـتا لەئەنـدازەبەدەر هەستی بە تەنیایی و ونبوویی دەکرد. سەرانسەری ژیانی لێ ببوە گاڵتە و درۆ. خۆی بە خۆی کوت:

"هاتوومە جیهان چم بە چکرد؟ تێگەی: هیچ

ئەم شێعرە زیاتر ئەوی شێت دەکرد. مانگەشەوێکی کەم رەنگ لە پشت هەورەکانەوە هـاتبوە دەرێ، بەڵام ئەو لە سێبەرەوە دەڕۆیشت، ئەم مانگەشەوەی وا پێشتر بۆ ئەو هێندە ئەفسووناوی و بێ مانا بوو و بە درێژایی چەند کاتژمێر لە دەرەوەی دەروازە لەگەڵ مانگدا راز و نیازی دەکرد، ئێستا رۆشناییەکی سارد و لووسکە و بـێ مانـا بوو و ئەوی تووڕە دەکرد. کەوتەوە بیری رۆژانی گەرم و کاتە درێژەکانی دەرسەوە، کەوتەوە بیری تـافی لاوی خۆی وا کاتێک تەواوی هاوتەمەنەکانی ئەو خەریکی عەیش و نۆش بـوون ئەو لەگەڵ چەنـد فەقێـدا لە رۆژانـی هاویندا ئارەقەی دەڕشت و کتێبی سەرف و نەحوی دەخوێند. دوایـیش دەڕۆیشـتن بـۆ کـۆڕی وتـووێژ لە گەڵ

مامۆستاکەیان شێخ محەممەد تەقی وا بە ژێرِ پاتۆڵەوە چۆکی دادەدا، قاپێک سەهۆڵاو لە بەرانبەریدا بــوو، خــۆی باوەشێن دەکرد و لەسەر وشەیێکی عەرەبی وا لە سەروژێرێکدا بەهەڵە چوبوون، هاواری دەکــرد، هەمــوو رەگــی بناملی هەڵدەستا، دەتکوت قیامەتە.

لەم کاتەدا شەقامەکان چۆڵ بوون و دووکانەکانیان داخستبوو. هەرکە چوە نێو شــەقامی عەلائــوددەولەوە دەنگــی مۆسیقا لە خەو دایچڵەکاند. لەسەر درگایەکی شین لەبەر رووناکایی چرای کارەبا خوێنــدیەوە "ماکســیم". بە بــێ مەحتەل بوون پەردەی بەرەکەیی لادا. چووە ناوەوە و لە پەنای مێزێکدا لەسەر چوارپاچکەیەک دانیشت.

میرزا حسەینعەلی چونکا هۆگری کافەوشتی وا نەبوو و هەتا ئێستا پێی نەنابووە جێگای وا، مات لە دەوروبەری خۆی دەڕوانی. بۆنی دووکەڵ، کەلەرم و گۆشتی سوورەوەکراو لەوێ بڵاو ببۆوە. پیــاوێکی کــورتە بــاڵای ســمێڵ قەوی قۆڵی هەڵماڵیبوو و لە پشت میزی خواردنەوە چۆرتکەی لێدەدا. ریزێــک بوتــڵ لە پەنایــدا قەتــار کرابــوو. کەمێ لەولاوەتر ژنێکی قەڵەو پیانۆی لێدەدا و پیاوێکی لەڕیش لە پەنایدا کەمانی دەژەنــد. مشــتەرییە رووســی و قەفقازیە مەســتەکانیش بە رواڵەتگەلێکــی ســەیر و ســەمەرەوە بە دەوری مێزەکــانەوە دانیشــتبوون. لەم کەیــن و بەینەدا ژنێکی تاڕادەیەک جوانیش وا زاراوەی بیانی هەبوو هاتە بەر مێزەکەی ئەوو بە بزەوە کوتی:

" ئازیزم، پەرداخێک شەڕابم نادەیتێ؟ "

" فەرموون."

ئەو ژنە بە بــێ راوەســتان خزمەتکــارەکەی بانــگ کــرد و داوای شــەڕابێکی کــرد وا ئەو نــاوی نەبیســتبوو. خزمەتکارەکە بوتڵێک شەڕاب و دوو پەرداخی بەرانبەری ئەوان دانا، ژنەکە تێی کرد و خــوڵکی ئەویشــی کــرد. میرزا حسەینعەلی بە نەوەدڵییەوە پەرداخی هەوەڵی هەڵهاویشــت، لەشــی گەرم داگرســا، بیــری تێکهــاڵا. ئەو ژنە پەرداخ بەشوێن پەرداخدا شەڕابی پــێ هەڵدەقوڕانــد. نــاڵەیەکی بەســۆز لە تــاڵی کەمــانەکەوە هەڵدەســتا، میــرزا حسەینعەلی  هەستی بە کەش و هەوایەکی رزگار و خۆشییەکی تایبەت لە خۆیدا دەکرد. کەوتە بیری ئەو هەمــوە پێداهەڵکوتنەی شەڕابەوە وا لە شێعری سۆفیاندا خوێندبوونیەوە. لەبەر رووناکایی بێبەزەیی چراکەدا چینەکــانی ژێرچاوی ئەو ژنەی دەدیت وا لە پەنایدا دانیشتبوو. دوای ئەو هەمووە پارێزانەی کردبووی، ئێستاکە شەڕابێکی زەردی ترش و ژنێکی خۆجوان کردووی قــۆڵترِ، دەســتپێکەیێندراوی قژلــوول بــوە قســمەتی، بەڵام ئەو زیــاتر لەمانە کەیفی دەهاتێ، چونکا بە بۆنەی ئاڵوگۆڕی حاڵ و هەوا و داگەڕانێکــی تــایبەت دەیەویســت خــۆی پەســت بکات و باشتر تەواوی دەردەکانی خۆی خراپ و پێشێل بکــات. ئەو لە تەشــقی بیــرە بەرزەکــانەوە دەیەویســت خۆی حەوا داتە نێو تاریکترین حەزەکانەوە. دەیەویست ببێتە گاڵتەجاڕی خەڵک، پێــی پێــبکەنن. دەیەویســت لە شێتیدا رێگای هەڵاتنێک بۆ خۆی بدۆزێتەوە. لەم کاتەدا خۆی بە شیاویی هەمــوو جــۆرە شــێتییەک دەزانــی. لە ژێر لچەوە بە خۆی دەکوت:

" کاتێ نەدار و پەستی، رابوێرە تۆ بە مەستی

ئەم گەوهەری ژیانە، سوالْکەر دەکاتە قارِوون! "

ئەو ژنە گورجییەی وا لە بەردەمیدا بوو، پێدەکەنی. میرزا حسەینعەلی چی لە پێداهەلْکوتنی مەی و بادە لە شێعری سۆفییانەدا خوێندبۆوە لە پێش چاویدا خۆی نواند. هەستی بە تەواویان دەکرد و تەواوی راز و سێرِرەکانی دەمووچاوی ئەم ژنەی بە ئاشکرا دەیخوێندەوە وا بەرانبەری دانیشتبوو. لەم کاتەدا ئەو بەختەوەر بوو، چونکا بەو شتانەی وا ئاواتەخوازیان بوو، گەیشتبوو و لە پشت هەلْمی نیانی شەرِابەوە ئەو شتەی بینی وا نەیدەتوانی بیهێنێتە پێش چاویشی. ئەوەی شێخ ئەبولفەزل لەخەویشدا نەیدەتوانی بیبینێ و ئەوەی کە باقی خەلْکیش نەیاندەتوانی رێگای تێبەن و دونیایەکی دیکەی پرِ لە سرِ خۆی بۆ ئەو نواند و تێگەیشت ئەوانەی وا ئەم دونیایەیان دەمکوت کردبوو، تەواوی وشەکان و شوبهاندنەکان و تەوسەکانی خۆیان لەوەوە وەرگرتبوو.

کاتێک میرزا حسەینعەلی هەستا هەتا حیسابەکەی پاکتاو بکات، خۆی بەسەر پێوە نەدەگرت. پارەدانەکەی دەرهێنا و دای بەو ژنەو دەستلەملان لە مەیخانەی ماکسیم چوونە دەرێ. لە نێو فایتۆنەکەدا میرزا حسەینعەلی سەری لەسەر سینگی ئەو ژنە دانابوو. هەستی بە بۆنی سپیاوەکەی ئەو دەکرد، دونیا لە پێش چاویدا هەلْدەخولا، رووناکایی چراکان لە بەردەمیدا هەلْدەپەرِان. ئەو ژنە بە زاراوەی گورجیەوە گۆرانییەکی بە سۆزی دەچرِی.

لە بەردرگای مالْی میرزا حسەینعەلیدا فایتۆنەکە رایگرت، لەگەلْ ئەو ژنە وەژوور کەوتن. بەلاْم نەچوو بەلای ئەو کۆما کایەی وا شەوانە لەسەری دەخەوت و ئەوی بردە سەر ئەو دۆشەگە سپییەی وا لە کتێبخانکەیدا کەوتبوو.

دوو رۆژ تێپەرِی و میرزا حسەینعەلی نەچوو بۆ سەر کاری قوتابخانە. رۆژی سێهەم لە رۆژنامەدا نووسیان:

" ئاغەی میرزا حسەینعەلی لە مامۆستا لاو و جیددییەکان بە هۆیەکی نەناسراوەوە خۆی کوشتوە."